# دەنگدان و پەرلەمان

## هێڵێکی سووری بیروباوەڕە

نووسینی: احسان برهان الدین





دەنگدان و پەرلەمان هێڵێکی سووری بیروباوەڕە

بسم الله الرحمن الرحیم

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: دەنگدان و پەرلەمان هێڵێکی سووری بیروباوەڕە

نووسینی: احسان برهان الدین

نەخشەسازیی بەرگ: عبدالله خاکی

نەخشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاکی

# دەنگدان و پەرلەمان هێڵێکی سووری بیروباوەڕە

یەکێك لەو مەسەلانەی لەم سەردەمەدا سەری هەڵداوەو بیدعەیەکە پەیوەندی بە کرۆك و جەوهەری تەوحید و عەقیدەوە هەیە، مەسەلەی دەنگدان و هەڵبژاردن و پەرلەمانە، جا لەبەر ئەوەی پێشتر زنجیرە باسێکی درێژم لەسەر ئەم بابەتە نووسیوە وهەندێ بە شیکراوەیی باسەکانم خستووەتەروو، بۆیە لێرەدا بە کورتی و بەبێ شیکردنەوە و ڕۆچوون لە هێنانەوەی بەڵگەکاندا ئاماژە بۆ ئەو پرسە دەکەم و پێناسەو حوکم و تێککگیرانی ئەو مەسەلە لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا لە چەند خاڵێکدا دەخەمەڕوو:

١- پەرلەمانەکان جێگای تەشریع دانان و هەڵوەشاندنەوەی شەریعەتی ئیسلام و ئەنجامدانی شیرك و حوکم کردنن بە غەیری قورئان و سوننەت، بۆیە موسوڵمان دەبێت بە هەموو شێوەیەك لە شێوەکانی بەشداریکردن لەو پرۆسەیەدا خۆی بەدوور بگرێت، چونکە ئەگەر بەشداری بکات دین و ئیمان و عەقیدە و بیروباوەڕی هەمووی خستووەتە ژێر پرسیار و مەترسییەوە.

٢- بنەمای هەرە بەهێزو تۆکمەی پەرلەمان و دیموکراسی کە بنەمایەکی پیرۆزە و قابیلی هیچ چەندوچون و مشتومڕێك نییە ئەوەیە سەرچاوەی حوکم و دەسەڵات بریتییە لە گەل (الشعب) لە رێگەی نوێنەرانی گەلەوە وەردەگیرێت وحوکم حوکمی گەلە نەك حوکمی شەریعەت و تەنانەت دەست پێکردنیش لەجیاتی ناوی الله بسم الله بەناوی گەل و خەڵکەوە دەست پێدەکرێت، لە جیاتی بسم الله دەوترێت باسم الشعب! بەوەش کۆڵەکەی هەر مەزنی تەوحید کە حوکم کردنە بە شەریعەت هەڵدەوەشێتەوە و وەلادەخرێت، هەرکێیش لەو پرۆسەدا بەشدار بێت لە لابردن و ڕەفزکردنی حوکمی قورئان بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت بەشدارە و هەر پاساوێك بهێنیتەوە خۆی دەخەڵەتێنێت وهیچی تر !



**٣- دەیان ئایەت لە قورئانی پیرۆزدا (بێگومان سوننەتیش بەهەمان شێوە) جەخت لەسەر بەستنەوەی ئیمانی موسوڵمان بە حوکم کردن بە قورئان و سوننەت دەبەستنەوە، بەڵام لەوێ بەلای زۆرەوە ئایەت و فەرموودە ئەگەر پێی ڕەوا ببینرێت بخرێتە دەنگدانەوە هاوتا لەگەڵ قسە و حوکمی مرۆڤەکانی تردا بە شێوەیەکی یەکسان و بێ جیاوازی، زۆریش دەگمەنە هیچ بابەتێکی شەرعی قورئان و سوننەت دەنگی پێویست بهێنێت، خۆ فیل هێلکە بکات و دەنگیش بهێنێت سەد ڕێگەی تر هەیە پوچەڵکردنەوەی دەرەنجامەکە و بۆ کارنەکردن بەو دەنگ بەدەست هێنانە و دواجار پشتگوێ دەخرێت.**

**الله تعالی فەرموویەتی:**

- **﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾[1].**
- **﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ﴾[2]**
- **﴿وَلا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾[3]**

---

[1] - يوسف ٤٠

[2] - المائدة:٥٠.

[3] - الكهف:٢٦.

- ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ﴾[1]
- ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾[2]
- ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾[3]

٤- ئەو کەسەی دەچێتە پەرلەمان دەبێت پێش هەموو شتێك سوێند بخوات و دەست بخاتە سەر قورئان کە پێچەوانەی قورئان وشەریعەتی ئیسلام کار بکات و ڕێز لە دیموکراسی و هەموو ئەو یاسا و ڕێسا پێچەوانانە لەگەڵ ئیسلامدا بگرێت و بەرگریان لی بکات و گەل بکاتە سەرچاوەی حوکم و واتایەکی مقدس و پیرۆز کە دەبێت گوێڕایەڵی بکات لە هەموو بڕیار و حەزو ئاراستەیەکیدا.

[1] - المائدة:٤٤-٤٧.

[2] - النساء:٦٥.

[3] - الشورى:٢١.

٥- لە پەرلەمان کار بە ڕاو بۆچوون و پەسەند کردنی زۆرینە دەکرێت، ئیتر با ئەو زۆرینەی سەد لەسەد پێچەوانەی شەریعەتیش بێت، ئەوە هیچ بایەخێکی نییە، قسەی الله و پیغەمبەرەکەی ﷺ هەر زۆر بەئاسانی ڕەتدەکرێتەوە و پیچەاونەکەی پەیرەو دەکرێت. زۆرینەش لە قورئاندا زەمکراوە و لە دەیان ئایەتدا دەردەکەویت زۆرینە خەڵکی گومرا و نەزان و شوێنکەوتووی هەواو ئارەزووی خۆیانن.

٦- هەرکێ بڵێت من بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و موسوڵمانان دەڕۆمە پەرلەمان ئەوە قسەو بانگەشەیەکە زۆر لە ڕاستییەوە دوورە چونکە ئەو قسەیە ڕاستەوخۆ لەگەڵ بنەماکانی تەوحید و ئیماندا تێك دەگیرێت و وەکو ئەوەیە بڵێت من لەڕێگەی شیرکەوە بانگەواز بۆ تەوحید دەکەم، لە کاتێکدا دەبوو بە ئەوپەڕی دڵنیایی بیوتبا من لەو شیرکە بەریم: ﴿وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾[1]



[1] - یوسف:١٠٨.

٧- قوڕەیش عوتبەی کوڕی ڕەبیعەیان بە نوێنەرایەتی خۆیان ناردە لای پێغەمبەر ﷺ و ئەویش پێی وت: ئەگەر لەم بانگەوازەتدا مەبەستت وەرگرتنی دەسەڵات و سەرۆکایەتییە، دەتکەین بەسەرۆکی خۆمان بە زمانی ئەم سەردەمەی خۆمان دەتکەین بەسەرۆك وەزیران یان سەرۆکی حکومەت، هەروەها پێی وت ئەگەر حەزت بەسەرگەورەیی و دەم سپێتییە دەتکەین بەدەم سپی و سەرگەورەی خۆمان بە دەربڕینی ئەم سەردەمەی خۆمان دەتکەین بە سەرۆکی پەرلەمان. ئەگەریش بە دوای پاشایەتیدا دەگەڕێیت دەتکەین بە پاشای خۆمان واتە دەتکەین بە سەرۆك کۆماری خۆمان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ هەموو ئەو بژاردانەی ڕەت کردەوەو لە وەڵامدا سەرەتای سورەتی (فصلت) ی بۆ خوێندنەوە، ﴿حمٓ * تَنزِيلٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ * كِتَٰبٞ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ * بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ * وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٖ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٞ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ * قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ﴾ واتە من بەردەوام دەبم لە ڕاگەیاندنی تەوحید و ڕەتکردنەوەی حوکمی هەموو تاغوتەکان و خۆی لە هەموو سیستمە شیرکییەکان بەری کرد .ڕێك

بە پیچەاونەی ئەوانەی ئەم سەردەمە کە ئەگەر شتێکی لەو جۆرە و زۆر کەمتریش لەو پێشنیارانە یەکسەر پێی ڕازی دەبن و بنەماکانی دینەکەشیانی بۆ دەشێوێنن و هەرزانفرۆش دەکەن.

٨- کۆچکردنی موسوڵمانان بۆ حەبەشە هیچ هۆکارێکی نەبوو جگە لە هەڵاتنی ئەوان بەدینەکەیان و پاراستنی تەوحید و ئیمانەکەیان نەبێت، خۆ ئەگەر کەمترین بوار بۆ تنازل و دابەزین لە عەقیدەدا هەبوایە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆی دووچاری ئەو ناڕەحەتییە نەدەکرد و لەگەڵ قوڕەیشدا جۆرێك لە سازش و نەرمی نیشان دەدا، یان بە مەنتیقی ئیسلامییەکانی ئەم سەردەمە بیت بەشداری لە دار الندوة دەکرد و چەند نوێنەرێکی بۆ ئەو شوێنە دەنارد بۆ ئەوەی کوفر و شیرکی قوڕەیش ڕەتبکەنەوەو دەست لە دژی بەرز بکەنەوە، بەڵام ئەوان جیاواز لە ئێمە کە سوڕەتی النساء و الأنعام و الأحزاب و الممتحنة و الکافرون و الإخلاص و هەموو قورئانی پیرۆزیان دەخوێندەوە هەرچی واتا و ماف و حوکمەکانی هەیە لە خۆیاندا بەرجەستەیان دەکرد و خوێندنەوەیەکی بێ گیانی ساردوسڕ نەبوو. لە ئیسلامدا بانگەواز وخزمەتکردنی ئیسلام تەنها

بەڕێگەی شەرعی و دوور لە شیرك و بیدعە ئەنجام دەدرێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(إن الله طيب لا يقبل إلا طيبا)**[١]

٩- بەشداریکردن لەو شوێنانەدا بەناو ئیسلامەوە سەرلێ تێکدانی موسوڵمانانە و شێواندنە بۆ چەمکەکانی عەقیدە و شەرعیەتدانە بە جێگایەك کە حوکمی الله تێیدا هیچ ڕێزێکی لێ ناگیرێت و نە کاریشی پی ناکرێت.

١٠- الله تعالى فەرموویەتی: **﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالاً مُّبِيناً﴾**[٢] واتە ئەگەر الله عزوجل حوکم و بڕیارێکی دا ئیتر هیچ ئیماندارێکی پیاو یان ژن هەڵبژاردنێکی جگە لە گوێڕایەڵی ڕەها لەبەردەمدا نامێنیت...بەڵام ئەوەی الله عزوجل لە قورئاندا فەرموویەتی و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە سوننەتدا فەرموویەتی لەو شوێنانەدا هیچ بایەخ و ڕێزیك نییە و دەدرێت بە دیواردا و دەخرێتە دەنگدانەوە.

---

[١] - صحيح مسلم.(١٠١٥)

[٢] - الأحزاب: ٣٦.

١١- الله عزوجل فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى الله مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ * وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ * أَفَحُكْمَ الجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[1]. واتە خەڵکی یان ئەوەیە ملکەچی حوکم و فەرمانەکانی الله ببن یان شوێنکەوتووی هەواو ئارەزووی جاهیلی خۆیان ببن، بێگومان موسوڵمانیش بەهیچ شێوەیەك شوێنکەوتەی غەیری حوکمی شەرع نابێت و بەبەهانەی لاوازتر لە ماڵی جاڵجاڵۆکە خۆی فریو نادات وماڵی خۆی بۆ.



[1] - المائدة: ٥٠

١٢- الله عزوجل توندترین حوکم و سزای ئاراستەی ئەوانە کردووە کە حوکم بەشەرعەکەی ناکەن و شوێنی هەواو ئارەزوو بەرنامەی مرۆڤەکان دەکەون و فەرموویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيداً * وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَى مَا أَنزَلَ اللّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُوداً﴾[١] تحاکم کردن بۆ غەیری شەریعەت لەلای الله کارێکە زۆر ڕقی لێیەتی و ئەنجامدەرانی لە ڕەحمەتی خۆی دەردەکات.

١٣- الله عزوجل ڕەتکردنەوەی طاغوت ی لەسەر ئیمان هێنان بە خۆی پێش خستووە، چونکە ئیمان دانامەزرێت ئەگەر خاوەنەکەی حوکمی غەیری الله بە تەواوی ڕەتنەکاتەوە و بەڕەهایی خۆی ڕادەستی شەریعەت و دینەکەی نەکات و فەرموویەتی: ﴿فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[٢].

---

[١] - النساء: ٦١.

[٢] - البقرة: ٢٥٦

١٤- عەلمانیەت و دیموکراسی و ناوو ناونیشانەکانی تر هەمووی جەوهەر و بنەمای پەرلەمان و دەنگدان و هەڵبژاردنە، هەموو ئەوانەش ڕاستەوخۆ و بە ئەوپەڕی ڕاشکاوی شەریعەت و بەرنامەی الله تعالی ڕەتدەکەنەوەو بەبەشێك لە کۆنە پەرستی و پاشماوە خراپەکانی سەدە تاریکەکان دایدەنێن.

١٥- موسوڵمان وابەستەیە و ناچارە و هیچ بژاردەیەکی لەبەردەستدا نییە جگە لە حوکم کردن بە شەریعەت وگەڕانەوە تەنها بۆ کیتاب و سوننەت، هەر جۆرە ئاوڕدانەوەیەك لە بەرنامە و یاسا دەستکردەکاندا، دەبێتە ڕەتکردنەوە بۆ حوکمی شەریعەت وەکو الله فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالاً مُّبِيناً﴾[١]

لە پەرلەماندا بوارێك نییە بۆ ڕێزگرتن چجای حوکم کردن بە شەریعەتی ئیسلام، لەباشترین حاڵەتدا ئایەتەکانی قورئان دەخرێتە دەنگدانەوە و دەنگی لەسەر دەدرێت، دەنگی هینا هینای نەشیهێنا وەکو قسەی هەر مرۆڤێکی ئاسایی ڕەت دەکرێتەوە و حیسابی بۆ

[١] - الأحزاب: ٣٦.

ناکرێت، ئیتر دەبێت کەسێك خۆی بە موسوڵمان بزانێت چۆن لە وەها جێگەیەکدا خۆی ببینێتەوە وبڵێت خزمەتی ئیسلامیش دەکەم.

ئایا درووستە کەسێك بە مەبەستی نوێژکردن بە میز دەستنوێژ بگرێت؟! خزمەت کردنی ئیسلام لەڕێگەی پەرلەمانەوە وەکو ئەو نموونەیە !

لەم مەسەلەیەشدا هەرکێ سەرپێچی بکات گومڕا دەبێت: ﴿وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالا مُبِينًا﴾[1].

بەڵکو موسوڵمان دەبێت گەلێك لەوە بترسێت و وریا بێت نەوەك بەو هۆیەوە لەڕێگەی ئیسلام دەربچێت: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[2]



---

[1] - الأحزاب:٣٦

[2] - النور:٦٣.

١٦- دەبێت موسوڵمان یەقینی هەبێت هەموو حوكمێك غەیری حوكمی شەریعەتی ئیسلام پێی دەوترێت حوكمی جاهیلییەت، واتە حوكمەكان یان حوكمی ئیسلامن یان جاهیلییەت، خەڵكیش ئازادن كامیان هەڵدەبژێرن: ﴿أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾[1] الله عزوجل بەو شەریعەتە موسوڵمانانی لە كەوتنە نێو داوی شیرك و كوفر پاراستووە و فەرموویەتی: ﴿وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللّهِ جَمِيعاً وَلاَ تَفَرَّقُوا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَاء فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِ إِخْوَاناً وَكُنتُمْ عَلَىَ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ النَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾[2]

١٧- الله عزوجل لە دەیان ئایەت بە ڕوونی و بەڕاشكاوی ئەوانەی كە بۆ غەیری بەرنامەكەی دەگەڕێنەوە بە كوفر و زوڵم و فیسق وەسف كردووە و كارەكەشیانی بە كاری ئەهلی جاهیلییەت داناوە وەكو لە ئایەتەكانی سوڕەتی المائدة و ئایەتەكانی تری سەرەوەدا ئاماژەی پێكرا.

---

[1] - المائدة: ٥٠

[2] - آل عمران: ١٠٣.

١٨- شوێنکەوتنی غەیری حوکمی الله و ڕێزگرتن لەبەرنامە و یاسا و ڕێسای پێچەوانەی حوکمی کیتاب و سوننەت ناوێکی تری نییە جگە لە شوێنکەوتنی هەواو حەزو ئارەزووی خاوەنەکەی وەکو فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى الله مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾[١]

١٩- لە بیانوو بەڵگە سەیرو سەمەرەکانی دیموکراسی خوازەکان ئەوەیە سەرگەورەمان یوسف علیه السلام دەکەنە بەڵگە بۆ بەشداریکردنیان لە پەرلەمانە شیرکییەکانی ئەم ڕۆژگارە و وەکو ئەوەی نەزانن کە پێغەمبەران علیهم السلام پێشەنگ و پێشەوای مرۆڤایەتین و هەموویان بۆ چەسپاندن بنەماکانی تەوحید ڕەوانە کراون نەك بۆ ڕوخاندنی، الله فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ

[١] - المائدة: ٤٤.

رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُوا اللّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ فَسِيرُوا فِي الأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾[1]

یوسف علیه السلام لە زیندانەکەیدا هەموو هەلێکی دەقۆستەوە بۆ بانگەوازکردن بۆ تەوحید و بۆ ئەوەی حوکم تەنها و تەنها بۆ الله یە عزوجل و دەیفەرموو: ﴿يَا صَاحِبَيِ السِّجْنِ أَأَرْبَابٌ مُّتَفَرِّقُونَ خَيْرٌ أَمِ اللّهُ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ * مَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِهِ إِلاَّ أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَآؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُوا إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ﴾[2].

یوسف علیه السلام لەو دەسەڵاتەی میسردا ئەندامێکی لاواز و بێ سەڵاحیات نەبوو تەنها دەست بەرزکردنەوەیەکی پێ بکرێت و تەواو! بەڵکو هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی بەدەستەوە بوو و حوکمی الله و شەریعەتەکەی لە میسردا لەسەر بنەمای تەوحید نەك شیرك دەچەسپاند: ﴿قَالَ إِنَّكَ الْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ﴾[3] ﴿وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاءُ﴾[4]

---

[1] - النحل: ٣٦.
[2] - یوسف: ٤٠
[3] - یوسف:٥٤.
[4] - یوسف: ٥٦.

**٢٠-** یەکێکی تر لە بیانووە لاوازەکانیان ئەوەیە دەڵێن ئێمە لەوێ هەڵە و خراپە و مەفسەدە چاك دەکەین، لە کاتێدا لە چەندین وڵاتدا بێ شەرمی ئەو جۆرە کەسانە دەگاتە ئەو ڕادەی دەڵێن ئێمە مەبست و ئامانجمان ئەوە نییە شەریعەت جێبەجێ بکرێت و داوای ئەوە ناکەین، بەڵکو بەردەوام باسی برایەتی و ئاشتی کۆمەڵایەتی و ئازادی بیروڕاو و سەرقاڵی داهێنان لە هونەری دابەزین و تنازل و شیواندنی دینەکەیاندا!

ئەم بیانووەش سەرباری ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی واقیعی لەسەر نییە و ئەوان جگە لە هەندێ بەرژەوەندی مادی نەبێت بۆ خۆیان وخێزان و حیزبەکانیان، کە ئەویش لەبری تێکدانی چەمکەکانی دینەکەیاندا پێیان دەدرێت، هیچ سوودێك نییە لە بەشداری کردنیان.

ئینجا چ مەفسەدەو خراپەیەك هەیە گەورەتر لە خراپەی شیرك ولابردنی حوکمی شەریعەت، چەند کەسانێکی لاواز و تا بیناقاقا خەریکی بەرژەوەندی کەسێتی خۆیان و تاقم و دەستەکانیانن دەبێت چ خێرێکیان بۆ ئیسلام هەبێت، ﴿فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ﴾[١]

---

[١] - یونس:٣٢.

٢١- لە درێژایی ئەزموونی هەموو ئەوانەی کە بەشداری پەرلەمانیان کردووە، هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان لەو ڕێگەوە نەگەیشتوون بە دەرەنجامێکی باش یان حوکمیان وەرگرتبێت و شەریعەتی ئیسلامیان جێبەجێ کردبێت، بەڵکو هەموو ئەوانەی کە سەر دەکەون بۆ ئەو شوێنە کەسانی دینفرۆش و سەرلێشێواو و خاوەن فەزیحەی جۆراوجۆرن.

ئەمڕۆ لەسەر زەویدا حیزبێکی ئیسلامی نییە گەورەتر و کاریگەرتر لە ئیخوان، حەفتا ساڵ هەوڵیاندا بگەن بەدەسەڵات و گوایە شەریعەت جێبەجێ بکەن، کاتێکیش لەو ساڵەی کە پێی گەیشتن نەیانتوانی تەنانەت مۆڵەتی ئافرەتە لەشفرۆشەکانیش نوێ نەکەنەوە، نەیانتوانی تەنانەت عارەق لە لیستی خوارنەوە داواکراوەکانی هێڵە ئاسمانیەکان لابدەن، لابردنیشیان و قەتڵ و عام کردنیان بە لاوازترین بەهانە بۆ نەیارەکانیان لە ئاوخواردن ئاسانتر بوو، نەك نەیانتوانی هیچ بەرگرییەك لە خۆیان بکەن، بەڵکو بەشانازییەوە خۆیان خستەبەر دەستی چەقۆکێشەکانی سیسی و ئەوەی کوژرا کوژرا و ئەوەشی نەکوژرا زیندانەکانیان لێ پڕ کردن، ئەو زەلیلیەشیان دا بەپاڵ ئیسلام گوایە ئیسلام داوای لێیان کردووە ئاوها بێ هەڵوێست بن و تەنانەت

نەیانتوانی بەرگری لە کچ و ژنەکانیشبان بکەن وبەناحەق کارەساتێکیان بەسەردا هێنان لە مێژوودا ستەمی وا لە کەس نەکراوە، ئەوەش لە درێژایی مێژووی ئیسلامییەکاندا بە گەورەترین بەروبوومی هەڵبژاردن دیتە ئەژمار کە ئەوە دەرەنجامەکەی بوو. جەزائیر و تونس و شوێنەکانی تریش حاڵیان لە میسر باشتر نەبوو.

یان ئەوانەی دەیانەوێت لە رێگەی پەرلەمانەوە بە حوکم بگەن، دەبێت وەکو تورکیا بن و دونیایەك گۆڕانکاری لە دینەکەیاندا بکەن تاکو لە لای ڕۆئاوا و ڕۆژهەلات پەسەند بێت ، ئەوەشی کە دەبینرێت لە پێناو ڕازیکردنی خەڵکی لە خۆیان کارێکیان بەسەر ئەو ئیسلامەدا هێناوە هەر نازانی ئەوە دینی ئیسلامە کە ئەوان مومارەسەی دەکەن و بەو حاڵەشەوە هێشتا ڕۆژئاوا لێییان ڕازی نین و بەتوندڕەویان دەزانن.



٢٢- لە راستیدا عەلمانیەت و دیموکراسی ئایینێکی نوێی هاوچەرخە و بۆ خەڵکانێکی زۆر بەدیلی ئیسلامیشە، گەل تێیدا ڕۆڵی پەروەردگار دەبینێت و دەسەڵاتەکانی وەردەگرێت، ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾[1] لە سیستمی دیموکراسیدا بەندەکان خۆیان حوکمی خۆیان دەکەن و دەسەڵاتی ڕەهای الله ڕەت دەکەنەوە، لە جیاتی قورئانیش دەستوور هەیە و ئەگەر پەرستگایەکیشی هەبێت ئەوە پەرلەمانە، ئەوەش واقعێکە ئەمڕۆ لە سەرتاسەری جیهاندا چەسپاوەو کاری پی دەکرێت و کەسیش ناتوانێت ئەو واقیعە ڕەفز بکات هەر بۆیە دواجار ئیسلامییەکان لەسەر ئەو پەندەی دڵێت ئەو دەستەی ناتوانیت بیبڕیت ماچی بکە ئەوانیش بوونە بەشێك لەو سیستمە و بەشداری کردنیان کرد بە بەشێك لە دین و دینداری !



[1] - الشورى:٢١.

٢٣- الله لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾[١]. بەڵام لە پەرلەمانەکانی سەر زەویدا ئەمڕۆ لە جیاتی ئەوە بە زمانی حاڵ دوترێت (إن الحكم إلا للشعب)، واتە حوکم تەنها بۆ شەعب و گەلە. هیچ کەسێکیش کە دەچێتە ئەو جێگا بۆی نییە ڕەخنە لەو بنەمایە بگرێت، بەڵکو دەبێت سویند لەسەر پاراستن و ڕێز لێگرتن و کارکردن بەو بنەمایە بخوا بەدەر لەوەی لە گەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا بەجارێك تێکدەگیرێت.

٢٤- هەرچی زانایەکیش فەتوای بۆ بەشداری کردن لە دەنگدان و پەرلەماندا دابێت هەڵەیە و نەیپێکاوە و خراپ لە واقیعی ئەو مەسەلە تێگەیەندراوە، بۆ نموونە شێخ ابن باز، هەموو بەڵگەکان لەسەر ئەوەن ئەو ئەسڵەن لە حەقیقەت و شێوەی پەرلەمان و دەنگدان هەر تێنەگەیشتووە بۆیە فەتواکەی وەکو ئەوەیە باسی شتێکی تر بکات، ئەو هەر ئاگادار نەکراوەتەوە کە ئەو جۆرە سویندخواردنەی تێدایە ولە دستور و سوێندخواردن لەسەر جێبەجێکردنی وئەوشتانە وادیارە بێ ئاگابووە، وەکو شێخ علی الخضیر ئاماژەی پێ دەکات، نە زانیشێتی

---

[١] - یوسف:٤٠

کە هەڵبژاردن بەشێکە لە دیموکراسی، چونکە ئەو لە شتی زۆر لەوانە بچووکتر توند بووە و فەتوای زۆر حەدی و توندی هەبووە، ئەو پەرلەمانەی کە ابن باز و ابن عثیمین فەتوای بەشداری کردنیان تێدا دەرکردووە، هیچ کات نەیازانیوە ئەو سوێندەی تێدا دەخورێت کە ڕێز لە دەستور بگیرێت و پارێزگاری لە یاسا و ڕێساگەلێك بکرێت کە پڕە لە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام و عەقیدەکەی، ئەوان ئەسڵەن درووست کردنی حیزبی ئیسلامییان پێ حەڕامە و فەتوایان دەربارەی عەلمانیەت و دیموکراسی و حوکم نەکردن بە قورئان و...هتد هەر زۆر توندە چۆن ئەچن پەلمان بەو هەموو لادان و کارەساتانەوە بشەرعێنن؟! فەتواکانی تریان شایەتە لەسەر ئەوەی ناوەڕۆکی دەستور بەلایانەوە خراپترین وەسفەکانی شیرکی بەسەردا جێبەجی دەبێت ئیتر چۆن ڕێگە ئەدەن بەشداری شیرك بکرێت، بە کورتی پێکهاتەی پەرلەمان لە دیموکراسی و لە دەستور و دەسەڵاتی ئافرەت و دەرکردنی بڕیاری پێچەاونەی شەرع و دەیان مەسەلەی تر بە فەتوای ئەو دوو زانایە هەموو شیرکە و لادانە لە ئیسلام، ئیتر چۆن ئەگونجێت بڵێن بەڵام ئەوانە بەسەر یەکەوە بکرێت کێشەی نییە و بۆ عەقیدە هیچ زیانێکی نییە؟!

ئینجا ئەوان مرۆڤ بوونە و هەڵەیان بەسەردا تێدەپەڕێت و فشاریان لەسەر بووە و زۆر مەسەلەی تری ئاشکرا و نهێنی هەیە لەوانەیە کاریگەری لەسەر تێگەیشتن و فەتوانیان هەبێت، چۆن ئەگەر لە مەسەلەیەکی وا گەورەدا هەڵە بکەن دەگونجیت ئێمەش شوینکەوتووی هەڵەکانیان بین، خۆ ئەگەر ئەو دوو زانا دوو لە هاوەڵانیش بوایەن و حاشا لە هاوەڵان فەتوای وا بدەن یان دوو لە تابیعی و کەڵە پیاوەکانی ئیسلامیش بوایەن دەبوو هەر زۆر بە ئاسانی قسەکەیان ڕەت بکەینەوە و بلێن ئەوانە بەشەرن و نەیانپێکاوە! نەك بچین لە ئاوی لێڵدا ڕاوە ماسی بکەین و بلێین ئەوە زانای گەروەیە دەڵێت دەنگدان و پەرلەمان درووستە!

ئینجا زۆربەی ئەوانەی کە فەتوای ئەو دوو زانایە بۆ بەشداری کردن لە دەنگداندا دەهێننەوە، خۆیان گاڵتەیان بەو دوو زانایە دێت و بە زانای حەیز و نیفاس و بێ ئاگا لە واقیع ناویان دەبەن، بەڵام ئەم فتوایەیان چونکە بۆ گومڕایی خۆیان سوودی لێ دەبینن و دەیقۆزنەوە و کاری پی دەکەن و بەرگری لێ دەکەن! بچن بەرپەرچدانەوەکانی شێخ مقبل بن هادي الوادعي بۆ ابن باز و ئەوانەی تر بخویننەوە بۆ ئەوەی لە حەقیقەتی مەسەلەکە تێبگەن.

ئینجا بۆیە ناوی ئەو دوو زانایەم هێنا چونکە لە هەموو ئەوانی تر مەشهورتر و زاناترن.

قسەی زانا هیچ کات بۆ خۆی نابێتە بەڵگە، بەڵکو دەبێت بەڵگەی بۆ بهێنینەوە بۆ ئەوەی وەریگرین ئەگەر بەڵگەی لەسەر نەبوو دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا کائنا من کان بێت.

**٢٥-** لە ڕاستیدا ڕازی بوون بە دیموکراسی وعەلمانیەت وبە حوکمی مرۆڤەکان ودانانی لە جێگەی بەرنامە و حوکمی شەریعەت و وبە ئاسایی تەماشاکردنی بەرنامە و یاسا و ڕێسا نەیارەکان لەگەڵ ئیسلامدا وشەرعاندنیان و زۆر کار وکارەسات کە لەگەڵ عەقیدەو بیروباوەڕدا وسوێند خواردن لە سەر جێبەجێکردنی بابەتی دژوار لەگەڵ تەوحید و شەریعەتدا کەمێکە لەو دەرهاوێشتانەی کە لەگەڵ دینی ئیسلامدا ناگونجێت و تێکدەگیرێت وهەر هەمووی لە پرۆسەی دەنگداندا جێبەجێ دەبێت و دەنگدەر لە هەموو ئەو سەرپێچییانەی بیروباوەڕدا بەشدارێکی سەرەکی و کارایە.

بۆیە پێویستە موسوڵمان بەمەبەستی پاراستنی دین و ئیمانی لە سەروبەری ئەو پرۆسەیە بەری بێت و توخنی نەکەوێت و لەماڵی خۆیدا دابنیشێت، ئەوانەش کە خۆڵی لەچاو دەکەن بەوەی پێی دەڵێن ئەوە شایەتییە و پێویستە موسوڵمان لە شایەتیدان دوا نەکەوێت وئەم ئایەتەی بۆ دهێننەوە: ﴿وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾[1]

لە ڕاستیدا ئەوە پێی دەوترێت تدلیس و تەڵەیەکی شەیتانە با وریای خۆیان بن و تێی نەکەون، چونکە ئەگەر بکەونە ئەو داوەوە ئەم فەرموودەیان لەسەر جێبەیێ دەبێت: (خير الناس قرني ثم الذين يلونهم ثم الذين يلونهم ثم يجيء أقوام تسبق شهادة أحدهم يمينه ويمينه شهادته)[2] واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی چاکترینی خەڵك ئەوانەن کە لەسەردەمی منن و ئەوانەی بەدوای ئەواندا دێن وئەوانەش کە بەدوای ئەواندا دێن، بەلام لە دوای ئەوانەوە کەسانێك پەیدا دەبن شایەتیدانیان دەکەوێتە پێش سوێندحواردنیان و سوێند خواردنیان دەکەوێتە پێش شایەتیدانیان!

---

[1] - البقرة:٢٨٣

[2] - أخرجه البخاري ومسلم.

بەڵکو لەبەر ئەوەی پەرلەمان جێگای شیرك دانانە بۆ پەروەردگار و سەرچاوەی حوکم نەکردن و ڕەتکردنەوەی شەریعەتی ئیسلامە شایەتییەکە دەبێتە شایەتی زور و درۆ، الله لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ﴾[1].

زور واتە جوان کردنەوەی شتێکی ناشیرین، چی بێت لە شیرك و حوکم نەکردن بە شەریعەت ناشیرینتر بێت، چونکە لە ڕاستیدا دەنگدان بەشداری کردنە لە لابردن و هەڵوەشاندنەوەی حوکمی ئیسلام و جگە لەمەش هەرکێ قسەیەکی تر بکات خۆی چاك دەزانێت کە ڕاست ناکات وخۆڵ لەچاوی خەڵکی دەکات.



[1] - الفرقان:٧٢

**٢٦-** الله چۆن خالیق و بەدیهێنەر و پەروەردگارە، بەو شێوەیش حاکم و شەریعەت دانەرە، هیچ خالیق و بەدیهێنەرێك نییە جگە لە ئەو، هیچ موشەڕڕیع و یاسادانەرێکی حەقیش نییە جگە لە ئەو: ﴿أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[1] چۆن داوامان لێکراوە لە عیبادەتدا شەریك بۆ الله بڕیار نەدەین: ﴿وَلا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا﴾[2] بە هەمان شێوە داوامان لێکراوە لە حوکم کردن وتەشریعیدا شەریکی بۆ بڕیار نەدەین: ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا﴾[3]. محمد الأمين الشنقيطي رحمه الله دەڵێت: (فالإشراك بالله في حكمه، كالإشراك به في عبادته)[4]. واتە شەریکدانان بۆ الله لە حوکم کردنیدا وەکو شەریکدانانە بۆی لە پەرستنیدا.



[1] - الأعراف:٥٤.
[2] - الكهف:١١٠.
[3] - الكهف:٢٦.
[4] - أضواء البيان ٤/ ٤١٩.

٢٧- ئەو کەسەی یاسا و شەریعەت دادەنێت خۆی بردووەتە ئاستی پەروەردگار و بە کاری ئەو هەڵدەستێت، ئەو کەسەش کە دەنگی بۆ دەدات و پێی ڕازییە بەشدارە لەو شیرکەدا. ڕاستە ئەو کارە شایەتیە بەڵام شایەتییەکی زورە و شایەتیدانە لەسەر شیرك و ڕازیبوونە پێی و لە ڕۆژی قیامەتدا عاقیبەتەکەی دەبیننەوە: ﴿سَتُكْتَبُ شَهَادَتُهُمْ وَيُسْأَلُونَ﴾[1] شایەتییەکەیان دەنووسرێت و لەسەریشی پرسیاریان لێ دەکرێت.

٢٨- عەدی بن حاتم رضي الله عنه پێش موسوڵمان بوونی چووە لای پێغەمبەر ﷺ وخاچێکی لە ملدا بوو، پێغەمبەر ﷺ کە بینی بەو شێوە وتی ئەو بتە فڕێبدە، ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە: ﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾[2]. عدي وتی بەڵام ئێمە ئەوانمان نە دەپەرست، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەوان حەڵاڵیان حەرام نەدەکرد و حەرامیان حەڵاڵ دەکرد و ئێوەش گوێڕایەڵیان بوون؟ وتی بەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی ئەوەیە عیبادەت کردنیان، ئەمەش

[1] - الزخرف:١٩.
[2] - التوبة:٣١

بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكرایە لەسەر موشەڕڕیعەكانی ئەم سەردەمە جێبەجێ دەبێت.

**٢٩-** هەرچی حوكمێك كە الله تعالی لە قورئاندا داویێتی، یان پێغەمبەرەكەی ﷺ لە سوننەتدا داویێتی، ئەوە حوكمێكی بڕاوەو كۆتاییە و موافەقەو ڕازیبوونی مرۆڤەكانی ناوێت، ئایەت و فەرمووده بخرێتە دەنگدانەوە ئەوە شیركە با موافەقەشی لەسەر بكرێت، بەڵكو ئەگەر بڕیاری بەندەكان و مرۆڤە نوقسان و داماوەكان دەنگی لە بڕیاری الله و پێغەمبەرەكەی زیاتر هێنا قسەی مرۆڤەكان حوكمی پی دەكرێت و ئایەت و فەرمووده وەلا دەخرێن و دەڵێن دەنگی نەهێنا و تەواو! دەشبێتە یاسایەكی بەركار با سەد جار لەگەڵ شەریعەتدا ناكۆك و ناجۆر بێت.



٣٠- لە زۆربەی یاساکان و لە یاسای عێراقیشدا بنەمایەك هەیە پێویستە هەموو نوێنەرێکی گەل ڕێزی لی بگرێت و کاری پێ بکات و پێشێلی نەکات ئەوەیە کە: (لا يجوز سن أي قانون يتعارض مع الديمقراطية) واتە: قەدغەیە هیچ یاسایەکی ناکۆك لەگەڵ دیموکراسیدا دابنرێت، بەمەش ئەندامەکە بە خۆی دەڵێت ئیسلامی وابەستە و مولزەم دەبێت پێچەاونەی بەشێکی زۆر لە دینەکەی کار بکات و توانای باس کردنی چجای بەرپاکردنی زۆرێکیشی لە دینەکەی لە بنچینەوە نابێت.

٣١- بەشداری کردنی کەسێك کە خۆی بە موسوڵمان بزانێت لەو شوێنانە ڕازیبوونە بە یاسا و ڕێسا و ڕێنماییەکانی ئەو شوێنە و لە ڕاستیدا ناشتوانێت پێ بخاتە ناو تەلاری پەرلەمانەوە تاکو ئیمزا لەسەر زۆر شت نەکات کە لەگەڵ جەوهەری دین و ئیمان و عەقیدەکەیدا تێکدەگیرێت، ئیتر خۆی بەچی دەخەڵەتێنیت و خەڵکی داماو بەچی دەخەڵەتینێت ئەوەیان مەسەلەیەکی ترە.

**٣٢-** ئینجا جیاوازی نێوان دیموکراسی و شوری وەکو جیاوازی نێوان خۆڵ و زێڕە یان جیاوازی نێوان ئاسمان و ڕێسمان! دیموکراسی لە بنچینەدا بنەمایەکی فەلسەفی دژ بە تەوحیدی هەیە، ئەوەی بایەخ و قورسایی بێت بۆ شەریعەتی ئیسلام داینانێت و سەرچاوەی حوکم و فەرمان تێیدا بۆ گەلە، ئەسڵەن لە دیموکراسیدا شتێك نییە بەناوی داننان بە وەحی و بەرنامەی ئاسمانی لەلای الله دابەزیبێت، بەڵکو موشەڕڕیع لەلایەن خەڵکەوە هەڵدەبژێردرێن و چی بەباش بزانن بۆ بەرێوەبردن ژیانی خەڵکی بەدەر لە کیتاب و سوننەت وعەقیدەو شەریعەتی ئیسلام ئەوە تەشریع دەکەن، ئەوەش هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ پەرستنی بت و پەرستراوەکانی تر و گوێڕایەڵی کردنیان. ئەوەش لە کاتێکدایە کە شوری لە ئیسلامدا بۆ چەسپاندنی حوکمی قورئان و سوننەتە و هیچ بوارێکیان نییە تەشریعێکی ناکۆك لەگەڵ شەریعەتدا دابنێن. بەکورتی:

* ئەسڵ و سەرچاوەی دیموکراسی حوکمی گەلە و سەرچاوەی شوری قورئان و سوننەتە.

* ئەندامانی پەرلەمان و بازنە دیموکراسییەکان باوەڕیان بەشەریعەتی ئیسلام نییە یان هەشیانبێت ناتوانن حیسابی بۆ بکەن و لە کاتی تەشریعداناندا ڕێزی لێ بگرن چونکە ئەوە لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسیدا تیدەگیرێت، بەلام ئەندامانی شوری لە ئیسلامدا دەبێت لەکەسانی زانا و دانا و خاوەن زانستی شەرعی پێکبێن.

* دیموکراسیخوازان هیچ سنورێکی حەڵاڵ و حەرام نییە سڵی لێ بکەنەوە، بۆی هەیە هەر تەشریعێك بکەن کە سەدا سەد لەگەڵ شەریعەتدا ناکۆك بێت، بەڵام ئەندامانی شورا لە ئیسلامدا بۆیان نییە بەهیچ شێوەیەك سنووری حەڵاڵ و حەرام ببەزێنن و دەبێت تەواو وابەستەی قورئان و سوننەت بن.

* شورا لە ئیسلامدا تەنها لە کاتی پێویستدا بۆ مەسەلەیەك کە پەیوەندی بە باسێکی گرنگی موسوڵمانانەوە هەبێت دادەنیشن و قسەی لەسەر دەکەن، بەلام پەرلەمان و ئەو شوێنانەی بە دیموکراسی کار دەکەن و بۆ هەموو گەروەو گچکەیەك هەر قسە دەکەن و تەشریع دادەنێن.

* شورا ئەرکی ئەوەیە بیسەلمێنیت کە شەریعەتی ئیسلام تەنها بەرنامەی شیاوە بۆ بەڕیوەبردنی ژیان، بەڵام دیموکراسی زۆر جار هەوڵ بۆ پێچەوانەکەی دەدات.

* دیموکراسی واتە ئەوەی خەڵك بەباشی دەزانن ئەوە کاری پێ بکرێت و بکرێت بەیاسا. بەڵام شوری کاری ئەوەیە فەرمانەکانی الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ بچەسپێنێت و بیکات بە پەیڕەوی ژیانی خەڵکی.

**٣٣-** مەسەلەی دەنگدان و پەرلەمان بە هیچ شێوەیەك ناچێتە بابەتی خیلافی و بڵێیت ئەوە مەسەلەیەکی خیلافییە، چونکە ئەو کارە لە کرۆکی عەقیدەو تەوحیدی ربوبیة ی الله دادەنرێت، دەقەکانی قورئان و سوننەت کە لە دژی ئەو پرۆسە دەوستن و هەندێکیمان خستەڕوو ئەوەندە زۆرن بوارێك ناهێڵێتەوە بۆ ئەوەی کەسێك وا گومان ببات ڕێگەیەك هەیە بۆ شەرعاندنی.



**٣٤-** له نووسینی ترمدا هەندێ پرسیارم لەسەر ئەم پرسە کردووە. لێرەشدا بە کورتی هەندێکی دووبارە دەکەمەوە و وەڵامەکەشی بەبێ شیکردنەوە دەخەمەڕوو:

أ- ئایا ئیسلامییەکان لە هیچ وڵاتێکدا لەڕێگەی پەرلەمانەوە توانیویانە خزمەت بە دینەکەیان بکەن و هەرگیز زۆرینەبوونە، وەڵامیش ئەوەیە بەلێ زۆرینە بوونە و نەشیانتوانیوە هیچ سودێك بەدینەکەیان بگەیەنن و جەزائیر و میسر یش بەڵگەیەکی بەرجەستەن.

ب- ئایا عەلمانیەکان بەبەشداری کردنی ئیسلامییەکان خۆشحاڵن یان بێزارن، وەڵامەکەش بەکورتی ئەوەیە ئەوان هەر زۆر بەو کارەیان خۆشحاڵن لەبەر ئەوەی جۆرێکە لەشەرعیەتدان بە پرۆسەکە و هاندانە بۆ خەڵکانێکی زۆر بەشداری بکەن و هاوکات ئەوانیش سنوورەکانی دینکەیان دەبەزێنن و ئیسلامیش لەبەر چاوی خەڵکی دەشێوێنن و ناشیرین دەکەن، لەوانەش گرنگتر ئیسلامییەکان خاوەن هیچ کاریگەرییەکی سەربازی یان سیاسی و هیچ حیسابێکیان بۆ نەکرێت لەلای عەلمانییەکان، بیانەویت بە ڕۆژێك لەناویان دەبەن، بەڵام لەبەر ئەوەی وجودیان سوودی لە زیانی گەلێك زیاترە بۆیان ئەیانهێڵنەوەو یارمەتیشیان دەدەن بۆ مانەوە.

ج- ئایا ئەو ئیسلامییانەی کە بەشداری لە پەرلەمان دەکەن بەشداری کردنەکەیان لەسەر بنەمای زانستی و وردبوونەوەو وریابوونە لە نەبەزاندنی سنوورەکانی دین و ئیمان واتەخەڵکانی زانا و شارەزایان تێدایە؟ وەڵامیش زۆر بە کورتی نەخێر چونکە زۆربەی ئەوانە هەر نازانن عەقیدە مەعنا و پێناسەکەی چییە هەندێکیان لەگەڵ گەیشتنیان بەپەرلەمان هەوڵی سەفەر کردنی دەرەوەو وەرگرتنی ناسنامەی ئەروپا و بەدەستهێنانی شوققە و سەیارە و ژنهێنان و سولفە وەرگرتن و بگرە فەزیحەی زۆر ناشیریشیان لێ دەردەکەویت، ئەوەشیان وانەبن کە فیعلەن هەیانە بەو شیوە نین، بەڵام بەداخەوە ئەوانەیان یان گێل و نەزانن و وەکو ڕۆبۆتێکن لەوێ، یان خاوەن بەرژەوەندی و بەکارهێنراون وچییان لێ داوا بکرێت ئەوە دەکەن، ئەگینا کەسێك ئەلف و بێی عەقیدە بزانێت ناچێتە ئەو شوێنە!

د- ئایا ئەم شێوە لە کارکردن و خزمەت کردنی ئیسلام لە مێژووی ئیسلامدا هاوشێوەی هەیە هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لەسەر هەیە یان سەرکێشییەکە و لە پێناو بەرژەوەندی مادی و سیاسی و ناشیرینکردنی ئیسلامدا ئەنجام ئەدرێت؟ بێگومان وەڵامەکەش

بریتییە لە ئەم چەند وشەی کۆتاییە کە خستمەڕوو و کارەکەیان تەواو تەواو پێچەوانەی دینەکەیانە.

ه- ئایا کەسی ئاسایی و هاوڵاتی بێ لایەن ودوور لە سیاسەت وهەر کەسێك لەهەر حیزب و پێگەیەکدا بێت و بیەوێت دینی سەلامەت بێت لە هەڵبژاردندا چی بکات باشە، بێگومان دەبێت چەند ئەگەر شێرێکی برسی ببینێت دەبێت لێی هەڵبێت دەبێت بەو شێوە لەو پرۆسەیە هەڵبێت و توخنی نەکەویت ئەگینا دینی سەلامەت نابێت، خۆ ئەوە بۆ دونیایش بووەتە مەسەلەیەکی بەڵگە نەویست و وەکو ڕۆژی ڕوناك دیارە کە هیچ سوود و بەروبوومێکی بۆکەس نییە.



**٣٥-** با ئەو بەناو زانا و بانگخواز و نووسەر و مامۆستای ئایینیانەی باوەڕیان بەم پرۆسە هەیە لە الله بترسن و بزانن ئەو هاندانەی ئەوان بۆ خەڵکی بەمەبەستی بەشداریکردن لەو پرۆسەیە کارێکە پێچەوانەی عەقیدەیە و کارەکەیان هاندانی خەڵکییە بۆ ڕۆیشتن بۆ پێچەوانەی ڕەزامەندی الله و بەرپرسیارێتی هەڵە و لادانی ئەوان هەڵدەگرن بێ ئەوەی لە تاوان و لادانی ئەنجامدەرانیش کەم ببێتەوە! فەتوای لەو شێوە وەکو ئیمزا کردنە بەناوی پەروەرگارەوە، پەروەردگاریش هیچ کات فەرمان بە شیرك و بە مونکەر ووفەحشا ناکات ناکات: ﴿قُلْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ أَتَقُولُونَ عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ﴾[١]



[١] - الأعراف:٢٨.

**٣٦-** تەنها بە فیترەتی پاك موسوڵمان دەزانێت ئەو شوێنە بۆ موسوڵمان شیاو نییە بڕواتە ناوی، چونکە لەوێ دەبێت لەگەڵ مولحید و نەسرانی و یەهودی و هەموو جۆرە خاوەن دین و ڕەوشتێکی جیاوازدا دابنیشێت و ڕێزیش لە بیروڕای هەموویان بگرێت، ئایا ئەمە لەگەڵ عەقیدەی قورئان و سوننەتدا دێتەوە؟

لەوێ دەبێت سوێند بخورێت لەسەر جێبەجێکردنی دەستورێك کە دەیان و سەدان یاسا و ڕێنمایی و حوکمی پێچەاونەی شەرع و عەقیدەی ئیسلامی تێدایە، ئایا سوێند خواردنی لەو شێوە لە کوێی دین و ئیماندا جێگای دەبێتەوە؟ تۆ لەسەر بنەمای ویست و مەشیئەتی گەل دەچیتە ئەوێ و لەوێیش دەبێت هەمیشە لە جیاتی حوکم و شەریعەتی الله وابەستە بیت بە حوکم و شەریعەتی گەلەوە ئەگەر هەرچی بڕیارێك بدات، ئایا دەکرێت بچیتە ناو ئەو زەلکاوەو دوایی بەدەست بەرزنەکردنەوەیەك لەو هەموو قوڕو لیتەی شیرکە لە قیامەتدا بۆی دەربچیت وڕزگارت ببێت... ﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾[1]

---

[1] - القلم:٣٦.

**٣٧-** کاتێك کە یاسا یان بەشێك لە یاسا لەگەڵ شەریعەتدا دژوار بێت چۆن دەبێت موسوڵمان ئامانجی سەرەوەری یاسا بێت و کار بۆ ئەو ئامانجە بکات؟ کاتێك گەل یان بەشێك لەگەل لە بنچینەوە بە ئیسلام و شەریعەتەکەی ڕازی نەبێت چۆن ئەبێت موسوڵمان کار بۆ سەروەری گەل و بەدیهێنانی ئامانجەکانی بکات؟ کاتێك ئازادییەکان فراوان دەبن تاکو دەگاتە شەرعیەتدان بە هاوڕەگەزبازی و گۆڕینی سزاکان و لابردنی زۆر لە حوکمەکانی ئیسلام و زۆرێك لە ئەوەی کە الله پێی ڕازی نابێت، چۆن دەبێت موسوڵمان باس لە ئازادی بیروڕا و بەرگریکردن بکات لە بۆچوونی جیاواز؟



**٣٨- لێردا پرسیارێك باو دێتە ئارا، باشە ئەگەر دەنگ نەدەم چی بکەم و بەدیل چییە؟**

پرسیارێکی سادەو ساکارەو پرسیاری موسوڵمانێك نییە لە عەقیدەو لە دینەکەی باش تێگەیشتبێت، بەڵکو پرسیاری کەسێکە کە دوای حەشامات کەوتبێت و خۆیشی نەزانێت بەرەو کوی دەچێت! چونکە ئەو پرسیارکەرە مەبەستی ئەوەیە بڵێت هەر ئەبێت لە شتێدا بەشدار بێت و مەسەلەی دابڕان و دوورکەوتنەوەی لە بیری خۆی دوور خستووەتەوە، لە کاتێدا ئەرکی ئەوەیە لە نێوان دوو لادان و دوو گومراییدا هەردوکیان ڕەتبکاتەوە، لە نێوان دوور جۆر شیرك و بیدعەی گەورەو گەورەتردا دەبێت هەردوکیان ڕەتبکاتەوە نەك بە ئەهوەنەکەیان ڕازی بێت.

بەدیل ئەوەیە لە هەمووی بەری بیت و خەریکی دینداری خۆت بیت و سەرکێشی بەدینەکەتەوە نەکەیت و لە هەموو کۆمەڵ و حیزب وگرووپێك دوور بکەویتەوە، دەنگدان و پرۆسەی هەڵبژاردن ژیلەمۆیەکە بۆ دونیا و دۆزەخێکە بۆ قیامەت یەعنی چی بەدیل چییە بۆ دەنگدان؟ بەدیل حاشا کردن و دوورکەوتنەوەیە و توخن نەکەوتنی هیچ پرۆسەیەکی تریشە کە لەگەڵ دینەکەتدا نەگونجێت و نامۆ

بێت، هەر هەمووی بایکۆت بکە و ئەگەر قەپت بەڕەگی درەختێکدا کردووە بۆ ئەوەی تووشی فیتنە نەکرێیت لە دینەکەتدا وا بکە، نەك بڕیارت دابێت هەر دەبێت لە جۆرێك لە جۆرەکانی فیتنەی ئەم سەردەمە بەشدار بیت. شوێنکەوتووی باوکی پێغەمبەران بە علیه السلام و شوێنپێی ئەو هەڵگرە و بڵێ: ﴿وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا﴾[1] باشترین بەدیلیش ئەوەیە کە إبراهیم علیه السلام ئەنجامیدا و الله عزوجل داوامان لێ ئەکات ئەو بکەین بە پێشەنگ و پێشەواو ڕابەری خۆمان و حاشا لە هەموو شتێك بکەین کە لەگەڵ الله و شەرعەکەیدا شیرکی پێ دەکرێت: ﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ﴾[2]



---

[1] - مريم:٤٨.

[2] - الممتحنة:٤.

**٣٩-** ئەمڕۆ کە شەریعەتی ئیسلام تعطیل کراوە و کاری پێناکرێت معنای ئەوە نییە موسوڵمان خۆی بخاتە نیو زەلکاوی جاهیلییەت و بە درووشمی بریقەدار بخەڵەتێت و عەقیدەو بیروباوەری خۆی لەکەدار بکات، تۆ وەکو موسوڵمان داوات لیَ کراوە لە هەر ناکۆکی و نیزاع و دووبەرەکییەکدا بۆ چارەسەرەکەی بگەڕێیتەوە بۆ قورئان و سونەت، نەك بۆ هیچ سەرچاوەیەکی تر: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا﴾[١] موسوڵمان لە هیچ کاروبارێکی دونیا و وارۆژیدا ڕێگەی پێنەدراوە بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەیەك پێچەوانەی کیتاب و سوننەت بێت: ﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾[٢]



[١] - النساء:٦٠.

[٢] - النساء:٥٩.

٤٠- ئەی موسوڵمانی بەرێز من لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار و لەبەر قەبر و قیامەتی خۆم ئامۆژگاریت دکەم و یەقینت هەبێت ئەم قسانەی من هەمووی دەبێت بەبەڵگە بەسەرتەوەو پێچەوانەکەی بکەیت تووشی لێپرسینەوەی لای الله دەبیت: یەقینت هەبێت و بۆ ساتێکیش گومانت نەبێت: دەنگدان کارێکی ناشەرعییە و لەگەڵ عەقیدەو بنەما جێگیرەکانی بیروباوەڕدا تێکدەگیرێت، بەشداریکردنت لەو پرۆسەیەدا لەکەدارکردنە بۆ دینەکەت، بۆ دونیاشت نەك هیچ سوودی نییە بەڵکو زیانێکی گەورەیە بۆ ئەویش، لێی بەری بە و لێی دووربکەرەوە و خۆت بە هیچ بیانوویەك، یان گومانی هیچ گومڕایەك مەخەڵەتێنە، بەو شێوە پاداشتی گەورەت دەبێت وسەرفراز دەبیت، ئەگەرنا ڕەنج بەخەسار و زەلیلی دونیا و دوارۆژ دەبێت: اللهم هل بلغت، اللهم فاشهد.

تێبینی: بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لە قسەی زانایان و سەرچاوەی پەیوەندیدار بینیوە.

